پەیامەکانی گەنجان ٣٢

زنجیرەی ئەخلاقناسی ٤



# کچە شیرینەکەم

منتدى اقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

نوسینی: عەلی تەنتاوی

وەرگێڕانی :موحەممەد مەلا ساڵح شارەزووری

پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان 

# کچە شیرینەکەم

نوسینی: عەلی تەنتاوی

وەرگێڕانی

مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری

زنجیره پەیامەکانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە (٣٢)

📖 ناوی کتێب: کچە شیرینەکەم

✍ نوسینی: عەلی تەنتاوی

✏ وەرگێڕانی: موحەممەد صالح ئەبوبکر شارەزووری

* ناوی زنجیرە: زنجیرەی ئەخلاقناسی

* ژمارەی زنجیرە: ٤

* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

* نۆبەی چاپ: دووەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٥

* ژمارەی لاپەڕە ٢٦ لاپەڕە

* دیزاین ڕێنوێن

* پێداچونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح

* چاپ چاپخانەی ڕێ نوێ

* سەرپەرشتیکار سەرکۆ کریم احمد

* ئیمەیل: renwen2009@yahoo.com

* ماڵپەڕ: www.aubyc.com

* نرخ : تەنها (١٠٠٠) دینار

( ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەکات )

## پێشکەشە بە:

* بەهەشت گیان - پارچەیەك لە جگەرم.

* بە خوشکەکانم، کە شانازی بە ڕەوشت بەرزی و خوا ویستیانەوە ئەکەم.

* بەو قوتابیە کچانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرسێکیان لا خوێندووم.

* بەو کچانەی ئەیانەوێت هەر ڕۆژە شەمامەی دەستی هەرزەکارێك نەبن.

* بە تۆ.....

م.شارەزووری

## کچە شیرینەکەم !

من پیاوێکی بەتەمەنم وا بەرەو چل ساڵی ئەڕۆم و ماڵئـاواییم لـە گـەنجی کـردووەو بارگـەو بنـەی ئەندێشـە و ڕاز و نیـازم لـە هەوارگـــەی لاویەتیـــەوە بـــەرەو بیابـــانی کاکیبـــەکاکی پـــیری خستووەتە ڕێ...

بەشـــی خـــۆم وڵاتـــان گـــەڕاوم و تێکـــەڵاویم لەگـــەڵ خەڵکیـــدا کردووە، پەند و ئامۆژگاریم لە ژیان وەرگرتووە

گـوێم لێبگـرە بـا وشـەیەکی ڕاسـت و ڕەوان و بـێ تـوێکڵ و بەپێی تەمەن و پلەی تاقیکردنەوەی خۆم بخەمە بەردەستت

وشەیەك لە هیچ کەسێکی ترت نەبیستووە و نایبیستیت!!.

## کچە نازدارەکەم !

زۆر هانای ڕەوشت دۆڕانمـان لێبەرزبۆتـەوەو هاوارمانکرد کە ڕەوشت لەدەست دەرچووەو فریای بکەون و قەڵاچۆی داوێـن پیسـی بکـەن، نـوکی پێنووسـەکانمان کـول بـووە ئەوەنـدەمان نووسـی، دەنگمـان نووسـا ئەوەنــدەمان هـاوار کـرد، هیچـمان نەکرد.. هیچ نەبێ تاقانە ڕەوشتێکمان پێ چارەسەر نەکرا بەڵکو هەتا دێت بێ ڕەوشتی زیاتر دەبێت، سفوری و بەڕەڵایی ئافرەت زیاتر دەبێـت و بازنەکـەی فراوانتر دەبێت و تیـژتر لـە وڵاتێکـەوە ئەڕوات بۆ وڵاتێکی تـر، لـە ناوچـەیەکەوە بۆ ناوچـەیەکی تـر... هەتا هیچ وڵاتێکی ئیسلامی نەماوە ئەم درمە پیسەی نەگرتبێت، تەنانەت ئەم ئافرەتـە کوردە موسڵمانەی کـە شـەرم و ئابڕووی لێ ئـەتکا خەسـتیکردبووە لــە خۆداپۆشـیندا ئێسـتا ئـەیانبینی سـفوورو قـۆڵ ڕووت و سـنگ دەرپـەڕیوو خـۆی تـەواو پـەتیارە کردووە

سـەرنەکەوتین لــە هاوارەکانمانــدا، بـاوەڕیش ناکــەم سەربکەوین... ئەزانی بۆچی؟

چونکە ئێمە هەتا ئەمڕۆش دەرگای چارەسەرمان لێ ونبووەو لێتێکچـووە، دەرگـای چارەسـەر لەبـەردەم تۆدایـە کچـم،بەڵێ لەبەردەم تۆ و دەستەخوشکەکانی تۆدایە، کلیلی دەرگـاش هـەر

بەئێوەیــە و بەتۆیــە، ئەگــەر بــۆت دەرکــەوت کــە دەرگــای چارەسـەرەکە لـە پێشـتەو هەوڵتـدا بیکەیتـەوەو لێبڕایـت بچـیتە ژوورەوە دۆخـی ڕەوشـت بەیـەکجاری دەگۆڕێـت و چارەسـەر ئەکرێت

بەڵێ کۆمەڵی پیاوان یەکەم هەنگاوی داوێنپیسی ئەنێن، هـەرگیز ئافرەت یەکەم هەنگاو نانێت، بەڵام ئەگەر تۆ ئامادەیی خۆتی بۆ پیشان نەدەیت ئەو هەرگیز ناتوانێت ئەو هەنگاوە بنێت و ئەگەر تۆ شل نەبی ئەو ناوێرێ...

کاتێـک خـۆت بەدەسـتی خـۆت دەرگـای شـەرەف و ئـابڕووت بـۆ کـردەوەو بـەدزی ئـابڕووت وتـت: فـەرموو! دواجـار ئـەو هـات و ئـابڕووتی دزی و ڕسـوای کـردی ئـەوجا بـەخۆت دەزانـی و ئەقیـژێنی و هـاوار ئەکـەیت: خەڵکینـە لـەڕایی خـوا فریـام کـەون شەرەفم بۆ پینە و پەڕۆ بکەن!

## کچە ئەشمیلەکەم !

خۆزگە بتزانیایە کە هەندێ لە پیاوان گورگن تۆش مەڕێکی دووگ چەوریت، ئەو کاتە چەندە مەڕ خۆی لە گورگ و گەلە گورگ ئەپاراست تۆش بەو شێوە لە پیاوە گورگەکان هەڵئەهاتیت، خۆزگە بتزانیایە پیاوان دزن و ئابڕووبەرن، ئەو کاتە تۆش بەقەد پیاوێکی چرووك و پارە خۆشەویست و پارەدار باسی خۆتت ئەکرد.

خۆ ئەگەر گورگ تەنها گۆشتی لە مەڕ ئەوێ، پیاوان زۆر لە گۆشت گرانتر و گرنگتریان لەتۆ دەوێ... بەنرخترین شتیان لەتۆ ئەوێ، ئابڕوو... ئەو ئابڕووەی قورسی و سووکی تۆی پێوە بەستراوە، ئەو ئابڕووەی لەناو خەڵکدا شانازی پێوە دەکەیت، ئەو ئابڕووەی بردنی گەلێك لە مردن گرانترە، کچم هەر گەنجێك کە ئافرەتێك ئەبینێ لە خەیاڵی خۆیدا ڕووتی ئەکاتەوە، بەڕووتی لەپێش چاوی خۆی ئەم دیو و ئەودیوی ئەکات، سەری زمانی لێ ئەدات و تامی ئەچێژێت

## کچە نازدارەکەم !

سوێندت بۆ ئەخۆم و بڕوام پێبکە، هەرچیت پێئەڵێم ڕاست ئەکەم، بڕوام پێ بکە، بڕوا بەو گەنجە مەکە کە ئەڵێ: تۆم تەنیا لەبەر ڕەوشتبەرزی و سەنگینی خۆشدەوێت. وشەی خۆشەویستییان کردۆتە داوو هەزاران کەو و نێچیری وەکو تۆی پێ ڕاوئەکەن، ئاخ ڕۆڵە گیان ! خۆزگە ئەو گەنجەی کەباسی خۆشەویستی تۆ دەکات کاتێك لەگەڵ کۆمەڵێك هەرزەکاری وەکو خۆی دائەنیشێت و باسی ئێوەی کچان ئەکەن، چاوێکت لێ ئەبوو گوێیەکت بۆ هەڵئەخست، ئەو کاتە ئەتزانی هەموو زەردەخەنەیەکی هەرزەکارانەی بۆ تۆ ژار و دەردێکی گرانەو هەرگیز بە زەردەخەنە وەڵامت نەئەدایەوەو شلیت بۆ نەئەنواند.

ئایا ئەزانی کاتێك ئەو وشەت بۆ ئەڕازێنێتەوەو پێکەنینت بۆ ئەخاتە چوارچێوەی گفتوگۆوە چ مەبەستێکی هەیە ؟ ئایا ئەزانی ئەوە پێشەکیە بۆ ئامانجێکی پیس؟

ئەزانی پێشەکین بۆ ڕابواردنی چەند چرکەو خولەکێك یان کاتژمێرێك پاشان لە یادی ئەچێ و وردە وردە خۆی لە تۆ ئەدزێتەوە بۆ ئەوەی بڕوات بگەڕێت بەدوای کچێکی تری هەژاردا و شەرەفی ئەویش برینددا بکات، بەڵێ ئەڕواو وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرئەچێ و دەم و پلی ئەسڕێ و وەکو نەبای دیبێ و نەباران

ئەو ئەرواو تۆ ئەمێنێتەوە... بەڵام چۆن مانەوەیەك... سکی پڕ.. دڵ غەمناك... سەرشۆڕی ناو کۆمەڵ و کۆمەڵگای ستەمکار، تۆ ئەکەن بە ژێر لێزمەی تف باران و نەفرینلێکردن و هەرزەکارە داوێنپیسەکەش لێ بوردراوە،ئەی چی بووە؟

گەنجەو لاوەو خوێنگەرمەو هەرزەکارەو هەڵەیەکی کردووەو گەڕاوەتەوە!

بەڵام ئەو کچە یاخوا سەری بتاشرێ پارچە پارچە بکرێ !!

بەو شێوەیە کۆمەڵ تەنیا تۆ بە تاوانبار دائەنێ، هەرگیز لێتنابوورێ، بەڵێ ئەگەر تۆ لە ڕێگا گەیشتی پێی و ڕووت لێ وەرچەرخان یەك دوو چرچت لەناو چاوانت دروست کرد چۆن ئەوێرێ هەر سەیریشت بکات، ناوێرێ...

خۆ ئەگەر زیاتر داوێنپیس بوو ویستی ئابڕووت چڵکن بکات و دەستدرێژی کرد ئەوکاتە تۆش دوو تفت بەدیاری پێ بەخشی و تاکە پێڵاوەکەت بۆ داکەند کێشات بەسەرو گوێلاکیدا، ئەو کاتە ئەتزانی هەرچی ڕێبواری سەر شەقامەکە هەیە هەموویان پشتیوانی تۆن، بەوەش شورەیەکی پۆڵاین بۆ خۆت دروستئەکەیت و نیشانەیەکی بقە لەسەر سینگت بەرامبەر هەموو بەرەڵایەك دائەنێیت، خۆ ئەو لاوەش ئەگەر نەختێ تینی شەرەفی تێدا مابێت دوایی دێت بۆلات و داوای لێبوردنت لێئەکات و بە شێوەیەك دەچیتە دڵیەوە کە ئەنێرێتە داخوازیت

بۆ ئـەوەی شـووی پێبکـەیت، بـەڵێ کچـم شـوو، چـونکە کـچ بگاتـە پۆپـەی بـەرزی کۆمەڵایـەتی، خـاوەنی چـەندەها سـامان و دارایـی بێ، تاقە هیوایەکی لەبیر ناچێتەوەو هەر لەپێش چاویەتی...

هیوای هەموو ئافرەتێك ئەوەیە ببێتە دایکێکی باش، کام ئافرەت کە پاشا و وەزیرە...

کام ئافرەت کە ئەوپەڕی سامانی هەیە وەکو بەرزترین بڕوانامـەی لە زانکۆکاندا هێناوە تەنانەت ئەکتەرە سینەماییەکانی هولیـوود (( کە ئێوە لە ساڵۆنی سینەمادا دەم داچەقاندنی سەرسـامیان بـۆ ئەکەنەوە)) تاقە ئامانجێکیان شووکردنە بە دڵی خۆیان، من دوو ئافرەتی ئەدیب ئەناسم یەکێکیان خـەڵکی میسرەو ئـەوی تریـان خـەڵکی شـام بـوو، بەرهـەمێکی فراوانیـان بـۆ خۆیـان پاشـەکەوت کردو سامانێکی زۆریان کۆکردەوە، نـاوی بـاش و هەڵکـەوتوویان بڵاوبـۆوە، بـەڵام هەرکـە دەرگـای شـوکردنیان لـەخۆیان داخسـت دەرگای زێڕیان لەسەر داخرا، شێت بوون...

بەڵام زۆرم لێ مەکە بۆ ناوەکانیان، هەردووکیان دیارن، شـووکردن هەموو ئامانجێکی ئافرەتە، بەڵێ ئەو ئافرەتە بەرەڵاو بێ ئـەدەبەی بەناوی سەربەستیەوە هەر ڕۆژەی پیاوێك ئەکاتە دەنکە کولەکـەو کـاتی پێئـەکوژێت تەنانـەت ئـەو پیاوانـەی کـە بـەناوی (داوات ئەکـەم)، کچـە هـەژارێکی داوێنپـاك ئەخاتـە داوی خۆیـەوەو هـەر ئەوەندە ڕاستی لەگەڵ ئەکات تا بۆی ئەخەڵەتێ و خۆی ئەدات

بەدەستەوە، خۆ ئەگەر خۆی بۆ شلکرد ئەوا پاش ماوەیەک ڕابواردن لەبەرچاوی سووک دەبێ و داوای ناکات، چونکە هیچ کەس حەزناکات هاوبەشی ژیانی و دایکی منداڵەکانی ئافرەتێکی سووک بێت...

## چاوەکەم رۆڵە گیان !

پیاو چەند شەرواڵ پیس و رەوشت نزم بێت ئەگەر لە بازاڕی ڕابواردندا ئافرەتێکی هەرزانی دەست نەکەوێت پێی ڕابورێ و ئابڕووی بخاتە ژێر پێڵاوەکانی وەکو شەمامە بیگرێ بەدەستەوە.

بەڵێ ئەوکات ئەگەر ئافرەتێکی وای دەست نەکەوێت لەسەر مەزەبی شەیتان پێکبێت و دەست تێکەڵاو بکەن و کە مەزهەبی بەهارێك بێنن، ئەوکاتە بەناچاری ئەگەڕێ بەدوای ئافرەتێکدا لەسەر مەزەبی ئادەمی لەسەر مەزەبی مرۆڤایەتی و ئیسلام مارەی ئەکات و بەحورمەت و ئابڕووەوە دەیگوێزێتەوەو ژیانێکی بەختیاری خێزانی پێکدەهێنن، کچم!

کەواتە شکاندنی بازاڕی خێزان و ژن و مێردی بەدەست ئێوەیە، ئەگەر خۆتان بەدەستی خۆتان بازاڕی ژن و مێردی نەشکێنن ناشکێت ئەگەر هەندێ ئافرەتی سووك و بێ (نرخ) لە ڕێگەی ناشەرعیەوە برسێتی ڕەگەزی (الجوع الجنسي) سکی پیاوان نەشکێنن بازاڕی خێزان و ژن و مێردی ناشکێت...
کەواتە بۆچی نوستوون ؟
کەواتە بۆچی ئافرەتە بەشەرەفەکانتان تێناکۆشن و چارەسەری ئەم بەڵایە... بەڵای بێڕەوشتی ناکەن ؟

ئێـوە لەپێشـترو بەدەسـەلاتترن لـە ئێمـەی کۆمـەڵی پیـاوان بـۆ چارەسەرکردنی، چونکە ئێوە خۆتـان لـە زمـانی یەکتر (ئافرەت) ئەگەن و شێوەو شێوازی وتوێژی ئافرەتـان ئـەزانن وە کەسـیش وەکو ئێوە زیانی تێدا ناکات، کچم!

دەزانـی چـەند ئـافرەتی بەشـەرەف و سـەنگین لـە ماڵـدا کـەوتوون مێردی باشیان دەست ناکەوێت شووی پێبکەن ؟

چـــونکە ئـــافرەتی بـــێ ڕەوشـــت لاوی ڕەوشـــت بـــەرزی نەهێشتۆتەوە،ئایا ئەزانی ئافرەتی سوك و ڕەوشـت نـزم ئەوەنـدە زۆر بونە خەریکە لاوان لە ژنهێنان وازبێنن بە ڕابواردن لەگەڵ ئەم کچ و ئەو کچ ئەو ئافرەتە ڕەوشت نزمە ئەو ئافرەتـە خۆفرۆشـەوە تەمەنیان ببەنەسەر.

## کچە شیرینەکەم !

لاشـەی ئـافرەت خـاوەنی کێشـکاریەکی (جاذبیـة)یـەکی زۆر بەتینـە بـۆ ڕاکێشـانی دڵـی پیـاو، بـەڵام ئەگـەر هـەر پارچـەیەکی لاشەی ئافرەت بە دەرەوە بوو، ئەو جازبیەی نامێنێ

لاشەی ئافرەت وەکو گۆشتی نـاو قوتـوو (معلبـات) وایـە هـەتا زیـاتر داپۆشـراوترو پوختـەتر هـەڵگیرابێ پاگـژو بـەنرخترە، بـەڵام ئەگەر سەری بەتاڵ بـوو یـان هـەڵخرابێ کـەس نـایکڕێ یـان پـیس خۆرێك ئـەیکڕێ. جا ئێوەش کە ناتانـەوێ لاشـەتان هەڵخـەن بـۆ مێشـی شـەڕواڵپیسـان وە ناتانـەوێ لـە نرخـی دایکایـەتیتان کـەم بێتەوە قۆڵی لێهەڵماڵن، لە دائیرەکان لە قوتابخانەکان لە زانکۆ لە کارگـە لـە کـۆڵان، لـە مەڵبەندەکانـدا لـە هـەموو جێگایـەك هـەوڵی گێڕانەوەی شەرەفی گەرد لێنیشتووی خۆیان بدەن، ئەویش بە گەڕانـەوەی ئـەو ئافرەتانـەی ڕێگـای شـەرەف و کەرامـەتیان لێ تێکچـووە، ئـەو ئافرەتانـەی لـە ڕێبـازی دروسـتکەرەکەیان (خواکـەیان) تـرازاون و نەخشـەی ژیانیـان لێ تێکچـووە (لـە گێڕانەوە دەرچووە) ئامۆژگاریان بکەن، نرخی چ ژن چ پیاویان تێبگەیـەنن، بیانترسـێنن لـە خـوا، خـۆ ئەگـەر لـەخوا ناترسـن تێیانبگەیەنن: جوانی بۆ کەس تا سەر نامێنـێ، وە پێیـان بڵـێن کاتـێ ئـافرەت لـە جوانیـەوە بـوو بـە پیرێـژن، نـە جوانی مـاو نـە

چاوی گەش، نە بالآی لاولاو و نە کوڵمی سوور نە لێوی ئاڵ هیچ هێزێك فریای ناکەوێ تەنیا ڕۆڵەکانی و نەوەکانی فریای ئەکەون. ئەگینا نە دڵداریەکانیان ئەمێنێ و نە وشەی ڕەنگینی هەرزەکارەکان. خۆ ئەگەر ئافرەت ئافرەتێکی ڕەوشت بەرزو دایکێکی دڵسۆز ماموستای قوتابخانەی ڕەوشتناسی بوو ئەو کاتە کە پیریش ئەبێ وەك پاشایەکی بەرز لەناو نەوەو وەچەکانی دەژی و هەتا مردن دەورو جێگای تایبەتی خۆی هەیە. بەلآم خۆ ئەگەر ئەمڕۆ لە گەنجیدا هەموو ئاوات و هیواو مەبەستێکی تەنیا دڵداری و ڕابواردن بێ و دوایی کە پیر بوو گەنجێتی و لاویەتی نەما ئەبێ چۆن بژی ؟

ئەبێ بەتەنیا بژی، تەنیا لە هەموو لایەکی ژیانەوە... جا توخوا ئەم سەردتنیە ئەم پاشەڕۆژە ئەهێنێ ؟

کەوابوو هەوڵی چاککردنی خوشکەکانتان بدەن و دەستیان بگرن و بیانگێڕنەوە سەر ڕاستە شەقامی ڕزگاری و لە هەڵەی ژیان بیانپارێزن، خۆ ئەگەر هەر چاریان ناکەن و داویانە لە دەریاو قوولیان تەڕ نابێ ئەوا خوشکەکانی ترتان ئاگادار بکەنەوە، ئەوەی ئەو نەخۆشیەی نەگرتووە ئاگاداری بکەن چاوپێچی لەسەر چاو لادەن و نرخی ڕەوشتیان پێ بڵێن.

## کچە شیرینەکەم !

وردە کراسەکانتان و بەرگەکانتان تەنك کرد، چەند ماوەیەکی دوور و درێــژ پیلانتــان دروســت کــرد بــۆ ئــەوەی لــە قۆنــاغی خۆداپۆشــینەوە بگوێزنــەوە بــۆ قۆنــاغێکی بــەرەڵایی ئەوەنــدە نەخشەکانتان وردو لەسەرخۆو دۆزەخیانە بوو هیچ پیاوێکی خاوەن هەستیش هەستی پێنەکرد، ئیتر با ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەش کە لە ژێــر تیشــکی (پرۆتۆکـۆلاتی) زانایــانی ســەهیۆنیزمدا ئەنووســن و دوژمنایـەتی بـاوك کوشـتە لەگـەڵ ڕەوشـتدا ئەکـەن، هـەموو ڕۆژێـك وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی ئافرەتی من نامەوێ ئێوەی کچان بە سەبرێك و دوو فــوو بگەنــە کــاروانی ئافرەتــە موســڵمانە پێشــکەوتووەکان و سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوڕێکانی (ڕەزای خوایان لێبێت)

دیارە بازێکی ئیجگار زلەو بە ئێوە هەڵناسوڕێ، بەڵکو داواتـان لێئەکـەم و لێتـان ئەپاڕێمـەوە هاوارتـان لێئەکـەم هـەنگاو بـە هـەنگاو بگەڕێنەوە بۆ ئابڕوو و شەرەف و کەرامەت و ڕەوشت

هـەنگاو بە هـەنگاو بگەڕێنـەوە هـەروەك چۆن کاتی خۆی هـەنگاو بە هـەنگاو دەسـتان لـە ڕەوشـت بەرداو بەرەو ڕەوشتنزمی کەوتنی ڕێ، وردە وردە بــەرەو خۆداپۆشــین وەرنــەوە، چــۆن کــاتی خــۆی وردە ڕووتیـان پیشـانئەدا، ئێسـتاش ئەیـدەن بـۆ ئـەوەی خـۆ زیـاتر بەرەڵا بکات هەتا بە شێوەیەك بێت کە ئابڕووی تکا نە ئیسلام و نە گاوور و نە ئاگرپەرستەکان و هیچ بێ ئایینێك پێی ڕازی نابێت.

**کچەکەم !**

ئەگەر دوو کەڵەشێر دڵیان چووە سەر مریشکێ بەیەکەوە هەر یەکەیان بـەجیا غـیرەت ئـەیگرێ و پێـی ناخۆشـە ئـەوی تریـان پەلاماری مریشکەکە بدات، چونکە بە شـەرەفی خـۆی ئـەزانێ، بە دەستدرێژی دائـەنێت لەبەر ئەوە هـەتا توانـای هـەبێت بـەرگری ئـەکات. بـەڵام لـە سەرچـنارو هاوینـە هـەواری سـەلاحەدین و شەقڵاوە و ئەسکەندەریەو بـەیروت دا پیـاوانی بـەناو موسـڵمان هـیچ غـیرەت نایـانگرێ، ژنـەکانیان خۆیـان ڕووتئەکەنـەوە بـە مایۆیەکەوە لەبەردەم بێگانەدا مەلە دەکەن نـەك تـەنیا دەم و چاو و سینگ، بەڵکو هـەموو شـوێنێکیان دەخەنـە ئەم دەشتە، تەنیا دوو پەنجـەی خـوارو دوو پەنجـەی سـنگیان دائەپۆشـن، لـە نادیەکانـداو لـە ئاهەنگـە شەونشـینەکاندا پیـاوە موسـڵمانە پێشـکەوتووەکان (نـا موسـڵمانەکان) خێزانـەکانیان پێشـکەش ئەکەن بە بێگانەیەك بۆ ئەوەی هەندێك پێکەوە تویس بکـەن و خۆیان بلکێنن بە یەکـەوە، سینگ لەسـەر سینگ وەك بنوسـێ بە یەکەوە دەم لەسەر کوڵم و لاشە لەنێوان باوەش، مێردەکەشی لەو لایانەوە وەستاوە یان ئەویش ژنی پیاوەکەی لەباوەشدایە!!

هیچ قەیدی نیە پێشکەوتنخوازییە!!

خۆ لە زانکۆکاندا (زانکۆی وڵاتە ئیسلامیەکان) بەداخەوە زۆر لە خوشــکە قوتابیــەکان ئێســتاش بــەرەڵایی و زانیــاری لەیــەك جیاناکەنــەوە، وا ئــەزانێ شــورەییە قوتــابی زانکــۆ بێــت و خــۆی داپۆشێ، دایك و باوکیشیان چاویان نییە یان چاویان ئەنوقێنن لە ئامۆژگاری و تێگەیاندنیان، بە شێوەیەکی هەڵە پەروەردەیان کردووە هەتا زیاتر لەگەڵ کچەکانیان خەریك بن زیاتر بەو لاوە ئەچن. ئەوانەو هەزاران تابلۆی تری بێ ئابڕوویی لەناو گەلانی موسڵماندا کە لە ئەوروپا و ئیمپریالیزمەکانیانەوە فێری بون، ئەم تەپوتۆزی بێرەوشتیە بە ڕۆژێك و دوو ڕۆژ یان ساڵێك و دوو ساڵ پاك ناکرێتەوەو چارەسەر ناکرێت، بەڵکو دەبێ هەر لەو ڕێگایەوە لەو جێگا پێیانەوە کە لە خێرەوە هاتن بۆ شەڕ، لە مرۆڤایەتیەوە بۆ ئاژەڵیی، ئەبێ هەر بەهەمان قۆناغدا بڕۆن و بگەڕێنەوە... ئەویش تاقە ڕێگای کڕینەوەی ئابڕووی بەتاڵان براومانە، با دەست پێبکەین بە نەهێشتنی تێکەڵاوی کوڕو کچی بێگانە بە یەکتری و تێکەڵاوی ژن و پیاوی برسی بۆ بریندارکردنی شەرەفی یەکتری... با دەست پێبکەین بەخۆداپۆشین.

کچم... مەبەستی من لە خۆداپۆشین ئەوە نییە خۆت بپێچیتەوە بە عەبایەکی ڕەشەوە پەچەیەکی ڕەشی ئەستوور بدەیت بەسەر دەم و چاوتا... نەخێر... مەبەستی من لە

خۆداپۆشین ئەوە نییە بەڵکو خۆداپۆشینی ئافرەت ئەوەیە کە خۆی داپۆشێ بەدەم و چاوو و هەردوو دەستی هەتا باسکەکەی ئیتر مەرج نییە عەبا بدات بەسەریدا. ئەو بەرگە ئیسلامیەی ئەو قوتابیە ئافرەتە موسڵمانەی لە زانکۆکان لەبەری ئەکەن زۆر شەرعین زۆر. چونکە نیشانەی گرتنی بەجێهێنانی ڕێگای فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایە(ﷺ)زۆر لە جوان جوانترە... چونکە هێمای بیروباوەڕێك و هێمای شەقامێکی سەربەخۆی ژیان نیشان ئەدات. دەك خوایە پیرۆزیان بێت دڵیان بە تیشکی زێڕینی خواپەرستی ڕووناك بکەیتەوە، ئەوان ئەزانن چۆن و بۆچی ئەم بەرگەیان لەبەر کردووە؟

ئەزانن ئەوە بەرگی ئەسمای دایك و عائیشەی مامۆستا و خەنسای جەنگاوەرو ڕابیعەی عەدەویەیە، جا ئەو کە بەو هەستەوە ئەو بەرگەی لەبەر کردبێ چۆن حەپەی ئەم و ئەو کاری تێدەکات ؟

چۆن چاوی لە ئامانجە سەرەکییەکەی خۆی ئەتروکێنێت؟

**کچە خۆشەویستەکەم !**

بـــەناوی شارســـتانێتی و پێشـــکەوتن و سەربەســـتییەوە ئابڕوویان تکاندن و شەرەفیان بریندار کردن...

ڕۆڵە چۆن ئەبێ بڕوا بکەن بە زوڕنای سەربازەکانی شەیتان کـە ئەیانـەوێ بـەناوی یەکسـانییەوە بتانخەڵـەتێنن و ئەیانـەوێ لەگـەڵ سروشـتی مرۆڤایـەتی دا بجەنگن، چۆن ژن دەبێ بەپیاو یان کوڕ دەبێ بە کچ ؟

ئایا هەر بەوەی هـەردووکیان یـەك جـۆر بەرگیان لەبەربێ یـەك جۆر قژ و بارۆکە بەکاربێنن ئیتر دەبن بەیەك ؟!

کاتــێ پیــاو ئـەتوانێ بڵــێ یەکســانی لــەنێوان ژن و پیــاودا دروست ئەبێت، ساڵێ ژن منداڵی ببێ و ساڵێ پیاو منـاڵی ببـێ و زۆر شتی تر..

نەخێر کچم ئەوانەی داوای یەکسانی ژن و پیاو دەکەن ڕاست ناکەن و درۆ ئەکـەن، چـونکە بـە دروشمـی یەکسـانی ئەیانـەوێ شوێنە هەست بزوێنـەکانی کۆمـەڵی ئافرەتـان دەربخـەن و خۆیـان چاوی زەق و چنۆکیان تێبەردەن

بەڵام چۆن ئەمەیان بۆ بلوێ ئەگەر یەکسەر بەکۆمەڵی ئافرەتان بڵـێن مەمکتان قیـت بکەنـەوە با ئێمـە سـەیری بکـەین دیـارە هـیچ ئافرەتێکی بەشەرف لێیان قبوڵ ناکات بە تاکە پێڵاو کاکیلـەیان

ئەشکێنن. بەڵام بەناوی یەکسانییەوە (یەکسانی لە بەرگدا) زۆر بە باشی ئەوەی مەبەستی چەپەڵیان بێ بۆیان دێتە دی و بەهەر شێوەیەك ئەوان ئەیانەوێ ئافرەتان دێنە بەردەستیان. درۆ ئەکەن، چونکە هیچ ئافرەتێك بە بەرەڵایی نەبووە بەشت، بەڵکو بە خوێندن و خۆماندووکردن و تێکۆشان بون بەو ئافرەتانەی کە لە لاپەڕەکانی مێژوودا ناوی نەمری خۆیان تۆمارکردووە. ئەو ئەوروپایەی کە ڕووگە (قیبلە)یانە باپرسیاری لێبکەن و گوێ لە ناڵەی پاریس و سویدو لەندەن و بەرلین و نیویۆرك بگرن و بزانن چۆن ئەتلێنەوە بەدەست زەرەری بەڕەڵاییەوە؟

ئەگەر بەڕەڵایی چاك بووایە پەیوەندی بە زانیارییەوە بوایە لە سەدەی زێڕینی ئێمەدا لەناو ئەزهەرو نیزامیەو مستنصریەو بیارەو کۆیەو قوتابخانە بەرزەکانی ئێمەوە دەرنەئەچوو نەئەگەیشتە لای ئەوان. ئێستا با پرسیار بکەین و بزانین کە زۆر ماڵ و خێزان هەیە لە پاریس کچەکانیان لە تێکەڵاوی گەنجان ئەپارێزن و ئەو نەختە شەرەفەی ماویانە خستویانەتە ناو پریاسکەیەکەوە کوناو کون هەڵی ئەگرن تەنانەت زۆر خێزانی پارس قەدەغەی کچەکانیان ئەکەن لە چوون بۆ فیلمی بەڕەڵایی.

کچەکەم هەندێ لە زوڕناژەنی کوفر ئەڵێن: ئەگەر کوڕو کچ تێکەڵاو بون و بە سەربەستی خۆیان پێکەوە گەڕان کێشەکانی ژیان کەمئەبێتەوە!

ئـەو خولیـا جنسـییە شـێتەی لـە دەروونـی مرۆڤـدا هەیـە دائەمرکێت... ئێمە وەڵامی ئەم سەر لێشێواوانە بە زانیاری و نزم کردنی بەرهـەم بدەینـەوە درێـژە ئەکێشـێ، بـەڵام ئـەڵێین بۆچـی ڕوسـیا ئەچێ بەگژ تێکەڵاویـداو تـا ڕادەیـەك قەدەغـەی دەکـات. بەڵێ ڕوسیا نە بە گوێی مەلا ئەکات و نە بـە گوێی قەشـە... یـان ئەمریکا... ئایا ئەزانی کاتێك کێشەی قوتابخانەکانیان ئەنووسن بۆچی یەکەم کێشەی قوتابخانەکان ئاوسبونی قوتابیە کچەکانە

ئایا ئەوە دڵسۆزییە بەم نیشتمان و گەلـە کەسێك بیـەوێ کچـە قوتابیـەکانی بێ مێـرد ئـاووس بـبن، یان بـا پرسـیارێ لـە سـوید بکـەین لەگـەڵ ئـەو هـەموو سەربەسـتی ڕابواردنـەدا کـە ئافرەتـانی سوید هەیەتی، ڕاستە کێشەیان نەماوە؟

بـەڵام بـا بـزانین ڕێـژەی خۆکوشـتن سـاڵ بـە سـاڵ چـەند بەرزئەبێتەوە.

## رۆڵە گیان !

من ڕوو ناکەمە هەرزەکارو گەنجەکان، ئەزانم ئەوان نەئەمبینن، نە گوێم لێئەگرن، بەڵکو گاڵتەشیان پێ دێ، چونکە من کامەرانی ڕابواردنیان لێتێکئەدەم...

تەنیا ڕوو ئەکەمە ئێوە کچەکانم... کچە شەریفە داپۆشراوە ئازیزەکانم!

هیچ کەس وەکو ئێوە زیانی لێ ناکەوێ، خۆتان پێشکەش بە قوتابخانەی شەیتان (ئەهریمەن) مەکەن.

بەگوێی ئەوانە مەکەن ژیانی تێکەڵاوی و بێ ئابڕووییتان بەناوی پێشکەتنخوازی و شارستانیەتی و ژیانی زانکۆییەوە لا شیرین ئەکەن، چونکە ئەوان زۆریان نەخێزانیان هەیە و نە دەربەس شەرەف و ئابڕووی خەڵکین، بەڵام من کە برای حەوت خوشکم کاتێ کە بەرگری لە ئێوە ئەکەم بەرگری لە خوشکەکانی خۆم ئەکەم، وە من ئەو خێرو بەرزی و شەرەف و ئابڕووەی بۆ خوشکەکانی خۆم ئەوێ بۆ کچانی تریش بەگشتی و کیژانی کورد بەتایبەتی ئەخوازم

بەڵام ئەو هەرزەکارانە هەرگیز دەست نادەنە پاڵی ئافرەتێکی کەوتوو، هەرگیز بەتەنگ ئابڕووی هیچ ئافرەتێکەوە نین، خۆ ئەگەر زۆر پێبنێن بە جەرگی خۆیانداو خۆشەویستی ئافرەت لە

دەروونیانــدا بــڕوێنن تــەنیا خۆشەویســتی ئــافرەتی جــوان ئەڕوێنن...

که جوانی نەما، که لاویەتی ئافرەتی جوان کەوتە گەڵا ڕێزان و ڕووزەردی پایز تەواو ڕووی تێکرد، خۆشەویستی چی؟

ئەوکاتە ئەڵێن: کەی تۆم دیوە کەی ئەتناسم کەی؟ کەی؟ کەی؟ دڵداری چی؟ پەیمانی چی؟ هەی هەی هەی..

**کچە شیرینەکەم !**

تـۆ لای ئیسـلام زۆر بـەنرخیت، تـۆ خـوا بـۆ ڕابـواردنی هـەرزەکارانی دروسـت نـەکردوویت، تـۆ نیـوەی کۆمـەڵی موسڵمانانیت، تۆ دایکیت، ئەو دایکەی کە بەهەشتی پیاوان لەژێر پێتدایە، ئەو پیاوەی خوا لێی ڕازی نابێت تا تۆ لێی ڕازی نەبیت !

**ئەی کچە شیرینەکەم !**

بۆچی ئێوە ڕابردووی پڕ شانازی خۆتان لە مێژووی ئیسلامدا لەیاد چۆتەوە ؟

کـە مێـژووی ئیسـلامی زێـڕینترین قۆناغـەکانی مێـژووی مرۆڤایەتین، ئێوەی ئافرەتان یەکەم کەس بون باوەڕتان هێنا بە ئیسـلام و پـێش ئێـوە ئافرەتـان یەکـەم کـەس بـون سـەری بەندایەتیتان بۆ خوا داناو نوێژتان کرد پێش پیاوان.

لـە هـەموو شـتێك گـرنگترو ئـەوەی جێگـای شـانازی هـەموو ئافرەتێکی بە شەرەفە لـە سەرانسـەری مێـژووی کۆن و تـازە و داهاتوودا ئەوەیـە کە: یەکەمی شـەهیدان و کاروانی شـەهیدانی بێ شوماری ئیسلام ئافرەت بوو پێش پیاو.

## کچە شیرینەکەم !

ئەمە بوو ئامۆژگاریەکانم بۆ تۆ، هەر ئەمەش ڕاستە بۆ تۆ کە لە منت بیست، زۆر چاك بزانە هەموو چاکیەك بەدەست تۆیەو بە دەستی پیاو نییە، ئەگەر ئارەزووت کرد خۆت چاك بکەی هەموو شتێك چاك ئەبێت، شەرەف و نەتەوەکەشت لە هەموو تەپ و تۆزو تانە و تەشەرێك ئەسڕێنەوە...

والسلام على من اتبع الهدى وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين..

